Humanities

## چینی کۆمەڵایەتی یان کەرتی سیاسی؟
## وردبوونەوە لە یەکەی شیکردنەوەی سیاسەتی ڕزگاریخواز

**ئەییووب کەریمی**[١]

بابەتی چینبەندی[٢] بابەتێکی دوورودرێژ و ئاڵۆزە و پێویستە لە کتێبەکانی کەسانی وەک مارکس، لوکاچ، گرامشی، پولانزاس، ئی. پی. تامپسن، بەرینگتن مۆر، رالف میلیبەند، ئێریک ئۆلین رایت و هتد بۆی بگەڕێین. ئاشکرایە ئەو کەسانەی دەیانەوێ بەقووڵی لە سیاسەتی چینایەتی[٣] لە ڕوانگەی مارکسیستییەوە بگەن، پێویستە سەرەتا لە نووسینەکانی ئەو بیرمەندانە شارەزا بن، پاشان بە لەبەرچاوگرتنی مێژوو، ئابووری، کولتوور و سیاسەتی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو بە کاری بهێنن. دیارە بەکارهێنانی تیۆری کاری هەر کەسێک نییە و هەندێک ئاستەنگی تایبەتی خۆی هەیە. هەروەها خراپ تێگەیشتن لە هەر تیۆرییەک، بەتایبەت ئەو تیۆرییانەی کە بڕیار وایە ببنە بنەمای کردەوەی کۆمەڵایەتی-سیاسی، کارەساتی لێ دەکەوێتەوە.

[١] دکتۆرای فەلسەفەی سیاسی، مامۆستای بەشی کۆمەڵناسی، زانکۆی سۆران (ayub.karimi@soc.soran.edu.krd)
[2] classification
[3] class politics

به لەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵە، لەم وتارەدا دەمەوێ بەکورتی ئاماژە بە بابەتێک بکەم کە خراپ-تێگەیشتن لێی بووەتە هۆی بەلارێدابردنی بزوتنەوەی کوردستان لە هەشتا ساڵی ڕابردوودا کە بەهۆی بەستراوەیی[1] و نەخوێندەواریی زۆربەی چەپەکانی کوردستان بەرهەم هاتووە و بەردەوام بەرهەم دێتەوە. چەپی کوردستان هەر وا بە تێگەیشتنی جیهانی سێهەمی و بۆچوونی ماوەبەسەرچووی خۆی سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان و سیاسەتەوە نووساوە و بەری نادا و کارەساتی وەک پێکهێنانی حیزبی پۆپولیست، چەندبەرەکایەتی-نانەوە لە کۆمەڵگەی کوردستان، پەراوێزخستنی چەند بەشی گرینگی کۆمەڵگەی کوردستان لە خەباتی نەتەوایەتی، شەڕی نێوخۆیی و خزمەت بە کۆلۆنیالیستەکان دەئافرێنێ. گیرۆدەبوونی زۆربەی چەپەکانی کوردستان بە ئیدیۆلۆژیی کۆلۆنیالیستەکان و هۆگرییان بۆ بەرژەوەندییە بەرتەسکەکانی خۆیان بووەتە هۆی ئەوەی ببنە بەشێک لە سوپای هزری و تەنانەت سەربازیی کۆلۆنیالیستەکان. هەربۆیە پێویستە ئەوکێشەیە لەڕووی تیۆریکەوە بخرێتە بەر باس بۆ ئەوەی لە داهاتوویەکی نیزیکدا یەکلایی بکرێتەوە.

### چینی کۆمەڵایەتی

هەروەک دەزانین، چەمکی چینی کۆمەڵایەتی هەم لە لایەن نا-مارکسیستەکانەوە بە کار هاتووە و هەم لە لایەن مارکسیستەکانەوە. بیرمەندە نا-مارکسیستەکان لەڕووی ئابوورییەوە، تێگەیشتنێکی ساکاریان لە چینی کۆمەڵایەتی هەیە و بەپێی "ڕادەی داهات" و شێوازی ژیان[2]چینەکان دابەش دەکەن بە دەوڵەمەند(یان سەروو)، ناوەند و هەژار (یان خواروو). بەڵام هاوکات نا-مارکسیستەکانی

[1] dependence
[2] lifestyle

وەک ڤیبەر، پارێتۆ، شومپیتر و هالبواکس لەڕووی کولتووری و سیاسییەوە، بابەتەکە ئاڵۆزتر دەبینن و پێوەری وەک شێوازی بەکارهێنان[1] ئەندامبوون لە حیزبی سیاسی، هاوسەرگیری لە نێوان ئەندامانی یەک چین، پرێستیژ، خوێندەواری، گەشەی بەهرەکان و ... بە کار دەهێنن.(1) لە ڕوانگەی زۆربەی نا-مارکسیستەکانەوە، بەتایبەت لیبراڵەکان، کۆمەڵگەیەک دڵخوازە کە زۆربەی خەڵکەکەی لە چینی ناوەند بن چونکە چینی ناوەند پێگەی دێموکراسییە و دەبێتە هۆی ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوان چینی دەوڵەمەند و چینی هەژار. ئاشکرایە کە چینبەندیی نا-مارکسیستی سوودێکی شیکارانەی ئەوتۆی بۆ سیاسەتی ڕزگاریخواز نییە چونکە تەنیا دیمەنێکی ساکارمان پێشان دەدا و کەمتر باسی سەرچاوەکانی نایەکسانی و ڕۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکان لە سیاسەتی ڕزگاریخوازدا دەکا.

بەڵام چینبەندیی مارکسی زۆر دەوڵەمەندترە چونکە لەسەر بنەمای پەیوەندیی خاوەندارانەی تاکەکان و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی سامان دامەزراوە کە بە شێوەیەکی بەرچاو دەناسرێ. هەروەها مارکسیسم پرۆژەیەکی سیاسی بۆ ڕزگاریی چینایەتی هەیە. ئەگەرچی چەمکی چینی کۆمەڵایەتی چەمکی سەرەکیی مارکسە بەڵام مارکس لە نووسینەکانیدا قەت بە شێوازێکی سیستماتیک و ڕوون پێناسەی بۆ ئەو چەمکە نەکرد. مارکس لە کۆتایی تەمەنیدا کاتێک بەرگی سێهەمی کاپیتالی بەنیوەچڵی دەنووسی، ویستی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ چینی کۆمەڵایەتی بە دەستەوە بدا بەڵام بەهۆی مردن کارەکەی ناتەواو مایەوە.(2) هەڵبەت یەکێک لە هۆکارەکانی خۆپاراستنی مارکس لە پێشکەشکردنی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ چەمکی چینی کۆمەڵایەتی بیرکردنەوەی دیالێکتیکییە کە پێناسەی نەگۆڕ هەڵناگرێ.

[1] consumption



Humanities

بەگشتی، ئەگەر لە کۆی نووسینەکانی مارکس ئەنجامێکی پوخت هەڵێنجین دەتوانین بڵێین کە چینی کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵێک خەڵک دەگوترێ کە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و سەرچاوەکانی داهات هاوشێوەیە و ئەوەش دەبێتە هۆی ژیانی ماددی، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، کولتوور و ئیدیۆلۆژیی هاوبەش. لە کۆمەڵگەی کاپیتالیستیدا، دوو چینی سەرەکی و دوو چینی لاوەکی هەن: دوو چینی سەرەکی و جەمسەری[1] واتە بورژوازی (ئەوانەی خاوەنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەن و خۆیان کار ناکەن) و پرۆلتاریا (ئەوانەی خاوەنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایە نین و ناچارن هێزی جەستە یان مێشکیان بفرۆشن)؛ و دوو چینی لاوەکی واتە وردەبورژوازی (ئەوانەی خاوەنی کەرەسەی بەرهەمهێنانی بچووکن و خۆشیان کاریان لەسەر دەکەن) و لۆمپەن پرۆلتاریا (ئەو هەژارانەی کە کار ناکەن و لە ڕێگای دزی، سواڵکردن، لەشفرۆشی و ... دەژین). واتە پەیوەندیی تاک و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایە پێگەی چینایەتیی ئەوان دیاری دەکا کە ئاشکرایە لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا بەردەوام لە حاڵی گۆڕاندایە. بەڵام لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە چینی کۆمەڵایەتی جۆرێک "پەیوەندی"یە، نەک ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی و بوونێکی نەگۆڕ. ئەگەر ئەو پەیوەندییە نەمێنێ، ئەو تاکە یان گرووپە لەو چینەدا نامێنێ و دەچێتە نێو چینێکی دیکە. تێگەیشتن لە سروشتی پەیوەندی-تەوەری چینی کۆمەڵایەتی بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی چینایەتی لە ڕوانگەی مارکسییەوە زۆر گرینگە.(3)

بەڵام دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە مارکس تەنێ باسی ئەو چینانەی لە سەرەوە باسمان کردن، ناکا بەڵکوو چینبەندیی کۆمەڵگەی کاپیتالیستی زۆر ئاڵۆزتر دەبینێ و لە نووسینە تیۆریکەکانیدا هەر

[1] polar classes

یەک لەو چینانە دابەش دەکاتە سەر چەند بەشی لاوەکیی دیکە. بۆ نموونە، لە کتێبی *هەژدەهەمی برومێری لویی بۆناپارت*دا کە سیاسیترین شیکردنەوەی چینایەتیی مارکسە، باسی چوار جۆر بورژوازی دەکا: بورژوازیی بازرگانی، بورژوازیی پیشەسازی، بورژوازیی ماڵی و بورژوازیی خاوەن زەوی. هەروەها کاتێک باسی جووتیارەکانی فەرانسە دەکا، دەڵێ جووتیارانی وردە-مالیک[1] گەورەترین چینی کۆمەڵایەتیی فەرانسەن بەڵام "وەک تەلیسێک پەتاتەن" کە بەهۆی شێوازی بەرهەمهێنانیان کە لە چوارچێوەی زەوییەکانیاندا هەموو پێداویستییەکانی خۆیان بە کوێرەوەری و چارەڕەشی دابین دەکەن، هیچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی بەهێز و هیچ ڕێکخراوێکی سیاسییان نییە هەربۆیە تاقمی بنەماڵەی ناپلیۆنی دووهەم نوێنەرایەتییان دەکەن.(4) واتە مارکس وێنایەکی زۆر ئاڵۆزتر لەو وێنا ساکارەی چەپی جیهانی سێهەم بە دەستەوە دەدا.

هەروەها دەزانین کە لە ڕوانگەی مارکسەوە، ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەی خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانن، کۆنترۆڵی کۆمەڵگەش دەکەن و سەردەستن و ئەوانەی خاوەن نین، دەسەڵاتیشیان نییە و بندەستن. مارکس پەیوەندیی نێوان چینەکان و دەوڵەت بە دوو مۆدێل دەخاتە بەر باس: مۆدێلی *ئامرازی* لە *مانیفێستی کۆمونیست* (کە دەڵێ: بەشی جێبەجێکاری دەوڵەت لە کۆمەڵگەی کاپیتالیستیدا هیچ نییە جگە لە کۆمیتەی کارگێڕیی کاروباری گشتیی هەموو بورژوازی)(5) کە دواتر لە لایەن کەسانی وەک رالف میلیبەند (لە کتێبی *دەوڵەت لە کۆمەڵگەی کاپیتالیستیدا*، ١٩٦٩)(6) درێژەی پێدرا، و مۆدێلی *ئۆتۆنۆمیی ڕێژەیی* لە *هەژدەهەمی برومێر* (کە دەڵێ: دەوڵەت لە کۆمەڵگەی کاپیتالیستیدا دەتوانێ هەتا ڕادەیەک سەربەخۆ لە چینە کۆمەڵایەتییەکان بجووڵێتەوە، هەرچەندە

1 smallholding peasantry



Journal of the Humanities گۆڤاری زانستی مرۆیی

کە فۆنکسیۆنی دەوڵەت ئەوەیە کە بەرژەوەندییەکانی چینێکی تایبەت دابین بکا) کە لە لایەن کەسانی وەک نیکۆس پولانزاس (لە کتێبی *دەسەڵاتی سیاسی و چینە کۆمەڵایەتییەکان*، ۱۹۷۳)[7] درێژەی پێ درا.

مارکس لە لایەکەوە، باسی چینی کۆمەڵایەتی-وەک-خۆی[1](وەک بوونێکی کۆمەڵایەتی-ئابووری) و چینی کۆمەڵایەتی-بۆ-خۆی[2](وەک بوونێکی سیاسی کە خاوەنی وشیاریی چینایەتی و ڕێکخستن و ئیدیۆلۆژی و پرۆژەی سیاسی خۆیەتی) دەکا و داوا دەکا چینی کرێکار ببێتە چینی کۆمەڵایەتی-بۆ-خۆی؛ بابەتێک کە تەنانەت لە وڵاتانی پێشکەوتووی کاپیتالیستی قەت نەهاتە دی. ئێستا دەزانین کە کرێکارەکان دەنگیان دا بە هیتلێر[8] و لەو ساڵانەی دواییدا زۆربەی چینی کرێکاری وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەورووپا پشتیوانییان لە سیاسەتوانە ڕاستەکان کردووە.[9] واتە چینی کرێکار بەپێچەوانەی وشیاریی چینایەتیی مەبەستی مارکس جووڵاوەتەوە و ئەجێندای ناسیۆنالیستی و تەنانەت فاشیستی هەڵبژاردووە.

بەگشتی، چینی کۆمەڵایەتی بابەتێکی یونیڤێرساله واتە لە دوای فۆرمگرتنی شارستانییەت هەتا ئێستا لە هەموو کۆمەڵگەکاندا چینی کۆمەڵایەتی هەبووە و هەیە بەڵام لە هەر کۆمەڵگەیەکدا چینەکان بەڕادەیەک دەسەڵاتیان نییە و ئەندامانی هەر چینێک بە شێوازی جۆراوجۆر دەجووڵێنەوە و ناتوانین بڵێین چینێکی تایبەت لە هەموو هەلومەرجێکی مێژوویيدا دەوری پێشکەوتنخوازانە یان پاشڤەڕۆیانەی هەیە. تەنانەت لە جیهانی ڕۆژئاوا چینی کرێکار هەمیشە پێشکەوتنخواز نییە و چینی بورژوا هەمیشە پاشڤەڕۆ نییە. ئەوە بابەتێکە کە تەنانەت مارکس

[1] class-in-itself
[2] class-for-itself

(سەبارەت بە بورژوازی)، سارتر (سەبارەت بە وردەبورژوازی) و مارکوزە (سەبارەت بە کرێکارەکان) دانیان پێ داناوە.

باشترین سەرچاوە بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە کتێبی بەرینگتن مۆر بە ناوی *ئاخێزگە کۆمەڵایەتییەکانی دیکتاتۆری و دێموکراسی*یە. دیارە مۆر کۆمەڵناسێکی مێژووییە و هاوکات کە لەژێر کاریگەریی مارکس و ڤیبەردایە، ڕەخنە لە هەردووکیان دەگرێ. مۆر لە کتێبەکەیدا پێشانمان دەدا کە پەیوەندییە نێو-چینایەتییەکان[1] بەتایبەت لە نێوان دەرەبەگ و بورژوا، لە سەردەمی کۆتاییهاتنی فیودالیسم و پەڕینەوە لە کۆمەڵگەی کشتوکاڵییەوە بەرەو کۆمەڵگەی پیشەسازی، چۆن جیهانی مۆدێرنی فۆرم بەخشیوە. لەم بوارەدا ئاماژە بە سێ ڕێگای گەشەسەندنی جیاواز دەکا: یەکەم، لەو وڵاتانەی کە چینی جووتیار لاواز بووە یان پەراوێز کەوتووە و بورژوازی بەهێز بووە، چینی دەرەبەگ ناچار بووە لەگەڵ بورژوازی ڕێکبکەوێ وئاستەنگ بۆ دێموکراتیزەبوون ساز نەکا یان ئەگەر بووەتە ئاستەنگ لە لایەن بورژوازییەوە فڕێ دراوە. لەو وڵاتانە، دێموکراسیی لیبرال سەری هەڵداوە کە لە هەندێکیاندا بە شێوازی هەتا ڕادەیەک ئاشتیخوازانە ڕووی داوە (وەک بریتانیا لە شۆڕشی شکۆداری ١٦٨٨) و لە هەندێکی دیکە توندوتیژی ڕووی داوە (وەک فەرانسە لە شۆڕشی مەزنی ١٧٨٩). دووهەم، لەو وڵاتانەی کە چینی جووتیار بەهێز بووە و هەڕەشەی بۆ چینە دەسەڵاتدارەکان ساز کردووە و بورژوازی لاواز بووە و ناچار بووە لەگەڵ پاشماوەکانی چینی دەرەبەگ هاوپەیمانییەکی چینایەتی-سیاسی پێک بهێنێ، فاشیسم سەری هەڵداوە؛ وەک ئالمانیا و ژاپۆن. سێهەم، لەو وڵاتانەی کە بورژوازی لاواز بووە و چینەکانی بورژوا و دەرەبەگ نەیانتوانیوە

---
[1] inter-class

کۆمەڵگە بەرەو مۆدێرنیزاسیۆن بەرن، کۆمونیستەکان جووتیارەکانیان ڕێکخستووە و شۆڕشی کۆمونیستی ڕووی داوە؛ وەک ڕووسیا و چین (واتە لە ڕوانگەی مۆرەوە، شۆڕشەکانی ڕووسیا لە ۱۹۱۷ و چین لە ۱۹٤۹شۆڕشی کرێکاری نەبوون بەڵکوو شۆڕشی جووتیاری بوون!).[10] لێکۆڵینەوەی مۆر پێشانمان دەدا کە تایبەتمەندییەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکان وڵات بە وڵات جیاوازە و بابەتەکە زۆر ئاڵۆزتر لەوەیە کە مێشکی ساکاری چەپی جیهانی سێهەم بیری لێ دەکاتەوە.

هەروەها بابەتی تایبەتمەندییەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکان، تەنانەت لەنێو خودی گوتاری مارکسیستیدا بیروبۆچوونی جیاوازی لەسەرە. بۆ نموونە، لە کاتێکدا کە مارکس ڕوانینێکی نەرێنی بۆ وردەبورژوازی هەبوو و نیومارکسیستەکانی وەک ئێریش فرۆم پێیان وا بوو کە وردەبورژوازی پێگەی کۆمەڵایەتیی فاشیسمە،[11] ژان پۆل سارتر پێی وا بوو کە وردەبورژوازی بکەری سەرەکیی شۆڕشە.[12] هەروەها بابەتی پۆلاریزەبوونی کۆمەڵگەی کاپیتالیستی (واتە توانەوەی هەموو چینە کۆمەڵایەتییەکان لە دوو جەمسەری بورژوازی و پرۆلتاریا) کە لە لایەن مارکسەوە پێشبینی کرابوو، نەهاتە دی[13] و چینبەندیی کۆمەڵگەی ئێستا ئەوەندە ئاڵۆزە کە خەباتی چینایەتی بردووەتە ژێر پرسیارەوە (هەڵبەت ئەوە بە واتای کۆتاییهاتنی ناتەبایی چینایەتی نییە). ئەوە جگە لەوەی کە بوونی چینێکی کۆمەڵایەتی وەک پرۆلتاریا و گرینگبوونی ئەو چینە لە کۆمەڵگەکانی وڵاتانی گەشەنەسەندوودا زۆر جێی مشتومڕە کە ئەوانەی مێژووی بزوتنەوەی چەپ و دژەکۆلۆنیالیستییان خوێندووەتەوە، لێی شارەزان.

بەڵام ئەو خاڵە گرینگەی کە لێرەدا دەمەوێ ئاماژەی پێ بدەم ئەوەیە کە لە وڵاتانی بەکۆلۆنیکراودا چینە کۆمەڵایەتییەکان وەک وڵاتانی سەربەخۆ نین چونکە دەسەڵاتێکی دەرەکی دەست بەسەر

هەموو سەرچاوەکانی کۆمەڵگەدا دادەگرێ، وڵات تاڵان دەکا و خەڵک دەچەوسێنێتەوە. وڵاتێک کە لە درێژماوەدا داگیر کراوە یان لە لایەن دەوڵەتێکی دیکەوە بەکۆلۆنی کراوە، پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەکەی دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کۆلۆنیالیسمەوە و ئێمە ناتوانین وەها کۆمەڵگەیەک بە هەمان شێوە شی بکەینەوە کە کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆ شی دەکەینەوە. دەوڵەتی کۆلۆنیالیست پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی وڵاتی بەکۆلۆنیکراو بە مەبەستی ڕووخاندنی ورەی ڕزگاریخوازی دەشێوێنێ؛ ئەگەرچی ئەو شێواندنە هەمیشە پاشڤەڕۆیانە نییە و زۆر جاران بە شێوەیەکی پێشبینی-نەکراو بە قازانجی وڵاتی بەکۆلۆنیکراو دەشکێتەوە. بۆ نموونە، دەستتێوەردانی بریتانیاییەکان لە سیستمی کاستیی[1]هیند و نەهێشتنی هەندێک دابونەریتی پاشڤەڕۆیانەی وەک ساتی[2](نەریتی خۆسووتاندنی ژن دوای مردنی مێرد) هەنگاوێکی پێشکەوتنخوازانە بوو؛ هەرچەندە دەتوانین ڕەخنەی زۆر لە کردەوەکانی بریتانیا لە هیندستان بگرین.

لە کوردستانیش، بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان هەنگاویان بۆ تێکدانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کوردستان ناوە، ئەگەرچی هەندێکیان ئەنجامی پێشکەوتنخوازانەیان لێ کەوتووەتەوە. یەکێک لەو بابەتانە نەهێشتنی سیستمی دەرەبەگایەتی (ئاغایەتی یان فیودالیسم) بووە. هەرچەندە هەندێک لە چاوەدێران پێیان وایە فیودالیسم لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەگشتی و لە کوردستان بەتایبەت هیچکات نەبووە بەڵام ئەو بەڵگانەی پێشکەشی دەکەن، زۆر لاوازن. دیارە فیودالیسم وەک یەکێک لە قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵایەتیی دوای کۆیلەداری لە کوردستانیش هەبووە و ئێمە دەتوانین بوونی دوو چینی

---

[1] caste system
[2] Sati or suttee

کۆمەڵایەتی (ئاغا یان دەرەبەگ وەک خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان لە لایەک و ڕەعیەت یان جووتیاری بێ-زەوی لە لایەکی دیکەوە) وەک ڕاستەقینەیەکی کۆمەڵایەتی بە بەڵگەوە پشتڕاست بکەینەوە. هەروەها پەیوەندیی نێوان ئەو دوو چینە لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی چینی جووتیاری بێ-زەوی بووە کە خۆی لە سیستمی کاری وەک دە-و-دوو دەردەخست.

بەڵام کاتێک لە ساڵی ١٩٦٣ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان چاکسازیی زەوی (ناسراو بە ئیسلاحاتی ئەرزی) دەستی پێ کرد، ئیدی شتێک بەناوی سیستمی دەرەبەگایەتی نەما. چاکسازیی زەوی و پەرەسەندنی کاپیتالیسم بوو بە هۆی تێکدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی فیودالیسم.[14] هەروەها چینێکی کۆمەڵایەتی بەناوی چینی دەرەبەگ یان ئاغاوەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەما. هەرچەندە لەوانەیە ئێستاش کەسانێک هەبن کە خۆیان پێ ئاغا بێ و بەهاکانی ئەو چینە لە نێویاندا مابێ بەڵام هەروەک دەزانین بنەمای چینی کۆمەڵایەتی لە هەردووک ڕوانگەی سەرەکیی مارکسی و ڤیبەریدا پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان و بەکارهێنانە. دوای ئیسلاحاتی ئەرزی شتێک بەناوی پەیوەندیی فیودالی لە نێوان ئاغا و جووتیاری بێ-زەویدا نەما. هەر ئێستا پاشماوەکانی چینی دەرەبەگ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان یان بوونەتە بورژوا، یان بوونەتە وردەبورژوا، تەنانەت بوونەتە کرێکاری هزری و جەستەیی. بەکورتی، ئێستا شتێک بەناوی دەرەبەگ یان ئاغاوەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەماوە[15] هەروەک چۆن شتێکیش بە ناوی ڕەعیەت یان جووتیاری بێ-زەوی نەماوە و کشتوکاڵیش وەک هەموو بوارەکانی دیکەی ئابووری بووەتە کاپیتالیستی.

ئەو لایەنەی چینایەتی کە لە پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتی ڕزگاریخوازدا گرینگە ئەوەیە کە لە ئێستادا سیاسەتی چینایەتی پەراوێز خراوە و شیکردنەوەی کۆمەڵگەکان بەپێی چینبەندی و

Humanities

تەرخانکردنی هەندێک تایبەتمەندی بە چینە کۆمەڵایەتییەکان بە مەبەستی پەرەپێدانی خەباتی چینایەتی ئیدی باوی نەماوە. دیارە ئەو ڕەوتە تەنانەت لە سەردەمی شەڕی ساردda سەرنجی زۆر بیرمەندی مارکسیستی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. بۆ نموونە، مارکوزە ئاماژە بەوە دەکا کە چینی کرێکار ئیدی شۆڕشگێڕ نەماوە و لە سیستمی کاپیتالیستیدا تواوەتەوە (بەتایبەت لە ئەمریکا) هەربۆیە مارکوزە بۆ پرۆژەی سیاسیی رادیکالی خۆی لیستێکی دیکە لە گرووپە شۆڕشگێڕەکان بە دەستەوە دەدا (قوتابیان، بێکاران، ژنان، کەمایەتییە نەژادییەکان و ...).[16] واتای ناڕاستەوخۆی بیرۆکەی مارکوزە ئەوەیە کە چینبەندی چی دیکە سوودی شیکارانەی بۆ سیاسەتی ڕزگاریخواز نەماوە بەڵام بەهۆی ئەوەی کە مارکوزە باوەڕی بە پرۆژەی سیاسیی مارکس هەیە و لایەنگری شۆڕشە، ئەو بابەتە بە ڕاشکاوی نادرکێنێ. بەگشتی، ئێمە دەتوانین لەنێو گرووپە رادیکالەکاندا ئەندامانی هەموو چینەکان ببینین و لەنێو گرووپە پاشڤەڕۆیەکانیشدا چینی کرێکار هەیە.

بەگشتی، چەمکی چینی کۆمەڵایەتی تەنانەت لەنێو گوتاری مارکسیستیدا سوودی خۆی بۆ سیاسەتی ڕزگاریخواز لە دەست داوە و تەنیا وەک ئامرازێکی شیکارانە بۆ ناسینی گرووپەکانی نێو کۆمەڵگەی کاپیتالیستی باوی ماوە. ئێستا زۆربەی مارکسیستەکان بۆ لای بابەتی وەک لێکۆڵینەوەی کولتووری، سیاسەتی ناسنامە، بەجیهانیبوون و ئابووریی سیاسیی نێونەتەوەیی ڕاکێشراون و کەمتر باسی خەباتی چینایەتی دەکەن. ئاشکرایە کە ئەوە بە واتای کۆتاییهاتنی خەباتی چینایەتی نییە چونکە ناتەبایی چینایەتی زۆر زیاتر بووە بەڵام پتربوونی ناتەبایی چینایەتی شتێکە و بەسیاسیبوونی ئەو ناتەباییە شتێکی دیکە. لەوانەیە لە داهاتوودا دیسان ئەو ناتەباییە بەسیاسی بێ و شۆڕشی کۆمەڵایەتیی دیکە (هاوشێوەی شۆڕشەکانی فەرانسە و ڕووسیا) ڕوو بدا بەڵام لە ئێستادا خەباتی چینایەتی تەنانەت لە وڵاتانی سەربەخۆدا پەراوێز خراوە.



Humanities

## کەرتی سیاسی

هەروەک باس کرا، چەمکی چینی کۆمەڵایەتی کاتێک لە وڵاتە بەکۆلۆنیکراوەکاندا بە کار دێ، نەک هەر سوودی نامێنێ بەڵکوو دەبێتە ئاستەنگێک بۆ شیکردنەوەی ئەو کۆمەڵگەیانە و خەباتی دژە-کۆلۆنیالیستی بە لاڕێدا دەبا. لێرەدایە کە بۆ یەکەی شیکردنەوەی[1] سیاسەتی ڕزگاریخواز لە وڵاتانی بەکۆلۆنیکراودا پێویستە بیر لە چەمکێکی دیکە بکەینەوە.

سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە خەنجەری کۆلۆنیالیسم کۆمەڵگەی داگیرکراو دەکاتە دوو کەرتی دیار. کۆلۆنیالیسم هەر تاک و گرووپێکی نەتەوەی بەکۆلۆنیکراو ناچار دەکا کە هەڵوێستی خۆی بەڕوونی یان بەشاراوەیی دەربڕێ کە ئایا لەگەڵ کۆلۆنیالیستەکانە یان لەگەڵ سەربەخۆیی وڵاتی بەکۆلۆنیکراو. هەربۆیە لەڕووی هەڵوێستی سیاسییەوە، لە کوردستان وەک وڵاتێکی بەکۆلۆنیکراو، هەموو چینە کۆمەڵایەتییەکان دابەش بوونە سەر دوو "کەرتی سیاسی": کەرتی کۆمپرادۆر (ئەوانەی یارمەتی کۆلۆنیالیستەکان دەدەن) و کەرتی نەتەوەیی (ئەوانەی دژ بە کۆلۆنیالیستەکانن). لە نێو کۆمپرادۆرەکاندا هەم بورژوا هەیە، هەم وردەبورژوا، هەم کرێکار و هەم لۆمپەن پرۆلتاریا. هەروەها لە نێو نەتەوەییەکاندا هەموو ئەو چینانە هەن. واتە بەپێچەوانەی شیکردنەوەی لێنینیستی و مائۆئیستی کە تایبەتمەندییەکی دیاریکراو دەلکێنن بە چینێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوەوە (بۆ نموونە دەڵێن کرێکارەکان پێشکەوتنخواز و شۆڕشگێڕن بەڵام بورژواکان پاشڤەڕۆن)، لە وڵاتانی بەکۆلۆنیکراودا کەرتی کۆمپرادۆر وەک داردەستی کۆلۆنیالیستەکان لە هەموو چینەکان پێک دێ و کەرتی نەتەوەییش لە هەموو چینەکان. چەمکی

[1] unit of analysis

"کەرتی کۆمپرادۆر" چەمکێکی نوێیە کە دامهێناوە و جیاوازە لە "بورژوازیی کۆمپرادۆر" و "چینی کۆمپرادۆر" کە نیومارکسیستەکان بە کاریان دەهێنن.(17) جیاوازیی نێوان چین و کەرت ئەوەیە کە چین ئاسۆییە بەڵام کەرت ستوونییە و چەندین چین لە خۆی دەگرێ. ئاشکرایە کە ئەو چەمکەش وەک هەموو چەمکەکانی بواری کۆمەڵایەتی-سیاسی "جۆری نموونەیی"ە[1] واتە سازکراوەیەکی شیکارانەیە و لە جیهانی ڕاستەقینەدا تاکەکان و گرووپەکان دەکەونە نێوان ئەو دوو جەمسەرە. بەکردەوە، تاکێک یان گرووپێکی کۆمەڵایەتی لەوانەیە لە هەندێک بواردا لەگەڵ کۆلۆنیالیستەکان هاوکاری بکا و لە هەندێک بواردا لەگەڵ نەتەوەییەکان بەڵام لەڕووی ئیدیۆلۆژییەوە، دوو کەرتی دیاریکراو لەهەمبەر یەکدیدا هەڵوێست دەگرن.

خوێندنەوەیەکی چینایەتی لە مێژووی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردستان لە دوو سەدەی ڕابردوودا ئەوەمان بەڕوونی بۆ ئاشکرا دەکا. بەپێی خوێندنەوەی من، کوردستان بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە: قۆناغی میرنشینەکان (لە سەرەتای هەزارەی دووهەم هەتا نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم)، قۆناغی داگیرکاری (لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم هەتا ١٩٢٠ەکان) و قۆناغی کۆلۆنیالیسم (لە ١٩٢٠ەکان هەتا ئێستا). مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لە نێوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەست پێ دەکا (جگە لە چەند ڕووداوی دەگمەنی وەک قەڵای دمدم) چونکە پێش ئەو کاتە، بوونی میرنشینە کوردییەکان لە هەردووک پارچەی کوردستان دەسەڵاتێکی هەتا ڕادەیەک سەربەخۆی بۆ کورد دەستەبەر کردبوو و ئێلیتی خۆجێیی کورد بە هۆی دەسەڵاتی ناوچەیی، هەستی بە پێویستبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی مۆدێرنی نەتەوەیی نەدەکرد. بەڵام لە کاتی لەنێوچوونی

[1] ideal type

میرنشینە کوردییەکانەوە، واتە لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا ئێستا، ناسیۆنالیسمی کورد وەک ئیدیۆلۆژی و بزوتنەوەی سەرەکی لە کوردستان خۆی لەهەمبەر داگیرکاری و کۆلۆنیالیسمی عەجەم و عەرەبدا دیتووەتەوە؛ ئەگەرچی بەهۆی دواکەوتوویی ئیمپراتۆریی عوسمانی و قاجار، لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا کوردستان لە سەرەتادا تووشی داگیرکاری بوو. سیستمی کۆلۆنیالیستیی مۆدێرن بەو شێوازەی کە ئێستا دەیبینین، لە دوای فۆرمگرتنی دەوڵەتی مۆدێرن (واتە دەوڵەتی تورکیا و دەوڵەتی ئێران لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو) جێگیر کراوە.

لە بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردستاندا هەموو چینەکان ڕۆلیان هەبووە؛ بە لایەنگری یان بە دژایەتی. زۆربەی سەرۆکەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی هەتا کاتی لەنێوچوونی دەرەبەگایەتی لە چینی دەرەبەگ یان وردە-دەرەبەگ بوون (شێخ عوبەیدوڵلا، هەمزاغا، سمکۆ، شێخ مەحموود، شێخ سەعید، سەید ڕەزا، شێخ ئەحمەد، مەلا مستەفا). تەنانەت دوای لەنێوچوونی دەرەبەگایەتیش، زۆربەی سەرۆکەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی لە پاشماوەکانی ئەو چینە بوون؛ بەهۆی ئەوەی کە دەرفەتی خوێندنیان زیاتر بۆ ڕەخسابوو و سەرمایەی سەمبۆلیک و کۆمەڵایەتییان (بە واتای بۆردیۆیی) پتر بوو. هاوکات زۆر کەسایەتی و خێڵی کوردستان کە بەشێک بوون لە چینی دەرەبەگ و پاشماوەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتی، هاوکاریی کۆلۆنیالیستەکانیان کردووە. لە کەرتی نەتەوەییدا هەموو چینەکانی دیکەش دەبیندرێن. چینی وردە-بورژوا لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەوری سەرەکی گێڕا (بۆ نموونە، دامەزرێنەران و چالاکانی ژ-کاف زۆربەیان لە چینی وردەبورژوا بوون) و ئێستاش بەشێکی گرینگ لەو کەرتەیە. بەڵام هەر لە مەهاباد، لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان، بەشێک لە چینی وردەبورژوا بوو بە داردەستێکی گرینگی کۆلۆنیالیسم؛ بەتایبەت لە بازاڕ و سیستمی ئیداریدا. هەروەها چینی وردەبورژوا بەستێنی بۆ تەشەنەی کولتووری کۆلۆنیالیستەکان و لاوازکردنی

کولتووری کوردی ئامادە کردووە. چینی کرێکار لە بزوتنەوەکانی ڕۆژهەڵات، باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان و هەروەها لە بزوتنەوەی کوردانی دیاسپۆرا دەوری گێڕاوە و ئێستاش بەردەوامە. هاوکات بەشێک لە چینی کرێکار، بەتایبەت کرێکاری هزری، بووەتە داردەستی کۆلۆنیالیستەکان کە خۆی لە بواری وەک هاوکاریی سیخوڕیدا زیاتر دەردەخا. تەنانەت لۆمپەن-پرۆلتاریاش بووەتە دوو کەرت. ئێمە دەتوانین لەنێو لۆمپەن-پرۆلتاریا هەم باوەڕمەندان بە خەباتی نەتەوایەتی ببینین و هەم داردەستەکانی کۆلۆنیالیسم (لە پەراوێزەکانی شارە گەورەکانی کوردستان کە شوێنی نیشتەجێبوونی بەشێک لە لۆمپەن-پرۆلتاریان، هاوکاری لەگەڵ کۆلۆنیالیستەکان زۆر بە ئاشکرایی دەبیندرێ).

هەربۆیە دەتوانین بڵێین لە کوردستان وەک نموونەی وڵاتانی بەکۆلۆنیکراودا هیچ پەیوەندییەک لە نێوان چینی کۆمەڵایەتی و هەڵوێستی سیاسیی تاکەکان و گرووپەکان لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازدا نییە و ئێمە تەنێ دەتوانین باسی کەرتی سیاسی بکەین. ئەوەی کە هۆکاری هەڵبژاردنی کەرتێکی سیاسیی تایبەت چییە و بۆچی هەندێک لە تاکەکان و گرووپەکان خۆیان لە سەنگەری یەکێک لەو کەرتانەدا دەبیننەوە، فرەڕەهەندە و پەیوەندی هەیە بە جۆری کەسایەتی، بەها زاڵەکانی نێو گرووپێکی کۆمەڵایەتی، مەیل بۆ دەسەڵات و بەرژەوەندی. بەڵام بەسەرنجدان بەوە کە جۆری کەسایەتی، بەهاکان، مەیل بۆ دەسەڵات و بەرژەوەندی بابەتگەلێکی بەرچاو یان کۆنکرێت نین و لە ژێر کاریگەریی ئیدیۆلۆژیدان، هەر تاکێک لە هەڵبژاردنی هەر کەرتێکی سیاسیدا بە شێوازێک پێناسە بۆ بەهاکان و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکا (بۆ نموونە، لە یەک خێزاندا دەبینین کە پیاوێک سەر بە کەرتی کۆمپرادۆرە لە کاتێکدا خوشکەکەی سەر بە کەرتی نەتەوەییە). واتە ئەو تاک و گرووپانەی کە پێناسەیان بۆ بەهاکان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بە جۆرێکە کە پێیان وایە بەهاکان و بەرژەوەندییە تاکەکەسی و گرووپییەکانیان لە سیستمی کۆلۆنیالیستیدا دابین دەکرێ، لەگەڵ

کۆلۆنیالیستەکان هاوکاری دەکەن بەڵام ئەوانەی کە بەهاکان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە کۆتاییهێنان بە کۆلۆنیالیسمدا دەبینن، لەگەڵ نەتەوەییەکان هاوکاری دەکەن. هەڵبەت ئاشکرایە کە ئەم بابەتەش تەواو ڕەش و سپی نییە و زۆرینەی خەڵک دەکەونە نێوان ئەو دوو جەمسەرە. هەر کەسێک لە کۆمەڵگەی کوردستان ژیابێ و تێبینیی ئەم بابەتەی کردبێ، دەتوانێ چەندین نموونە لەو ڕاستییە بدۆزێتەوە.

**ئەنجام**

ناکرێ نکۆڵی لە بوونی چینی کۆمەڵایەتی لە کوردستان بکەین. ئاشکرایە کە کۆمەڵگەی کوردستانیش کۆمەڵگەیەکی چینایەتییە و چینی کۆمەڵایەتی لە کوردستانیش وەک هەموو کۆمەڵگەکانی دیکە بە هەندێک جیاوازیی وردەوە هەیە. چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئێستای کوردستان وەک زۆربەی شوێنەکانی دیکەی سیستمی جیهانیی کاپیتالیستی بریتین لە تێکەڵاوێک لە تەیفەکانی بورژوازی، وردەبورژوازی، کرێکار و لۆمپەن پرۆلتاریا کە ئاڵۆزییەکی بەرچاو لەڕووی جووڵەی کۆمەڵایەتی و هەڵوێستی سیاسییەوە تێیاندا دەبیندرێ. شتێک بە ناوی چینی دەرەبەگ و چینی ڕەعیەت (جووتیاری بێ-زەوی) نەماوە چونکە سیستمی دەرەبەگایەتی وەک شێوازێکی بەرهەمهێنان لەنێو چووە و کاپیتالیسم زاڵ بووە؛ تەنانەت بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیش بووەتە کاپیتالیستی. بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی چەپی جیهانی سێهەم، دەوری چینەکان لە سیاسەتی کوردستاندا زۆر ئاڵۆز و تێکەڵاوە و ناتوانین تایبەتمەندییەکی دیاریکراو بلکێنین بە چینێکی دیاریکراوەوە.

چینەکانی کوردستان لە ئاکامی کۆلۆنیالیسمدا دابەش بوون بەسەر دوو کەرتی سیاسیدا: کەرتی کۆمپرادۆر و کەرتی نەتەوەیی. لەژێر کاریگەریی جۆری کەسایەتی، بەهاکان، مەیل بۆ بەرژەوەندی و

دەسەڵاتدا کە خۆیان بەرهەمی ئیدیۆلۆژین، کەرتی کۆمپرادۆر لەگەڵ کۆلۆنیالیستەکان هاوکاری دەکا بەڵام کەرتی نەتەوەیی دژی کۆلۆنیالیسمە. لە ئێستادا چینی کۆمەڵایەتی وەک یەکەی شیکردنەوە سوودی شیکارانەی خۆی بۆ سیاسەتی ڕزگاریخواز لە دەست داوە. بە گشتی، ململانێی چینایەتی لە وڵاتە بەکۆلۆنیکراوەکاندا هەتا کاتی چارەسەربوونی بنەڕەتیی کێشەی نەتەوایەتی (واتە سەربەخۆیی و سازکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی) پەراوێز دەخرێ. مێژووی هاوچەرخی کوردستان پێشانمان دەدا کە چالاککردنی کەلێنی چینایەتی دەبێتە هۆی دووبەرەکی لە کوردستان؛ دووبەرەکییەکی سازکراو کە تەنێ کۆلۆنیالسیتەکان کەڵکی لێ وەردەگرن. هەربۆیە بۆ سیاسەتی ڕزگاریخواز لە وڵاتانی بەکۆلۆنیکراودا لەجیاتی چینی کۆمەڵایەتی دەبێ لە چەمکی "کەرتی سیاسی" کەڵک وەرگرین. کەرتی سیاسی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بوونی کۆلۆنیالیسمەوە هەیە و ستوونییە، بەپێچەوانەی چینی کۆمەڵایەتی کە ئاسۆییە.

لە لایەکی دیکەوە، چەمکی کەرتی سیاسی یارمەتیمان دەدا تێبگەین کە بۆ چی لە وڵاتە بەکۆلۆنیکراوەکاندا تاکەکان و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بەو شێوازە هەڵوێست دەگرن و هەڵسوکەوت دەکەن کە دەیبینین. یەکێک لە دەرکەوتە هەرە گرینگەکانی شرۆڤەکردنی کوردستان وەک دوو کەرتی سیاسی ئەوەیە کە دەتوانێ یەکگرتوویەکی بەرچاو لە نێوان تاکەکان و گرووپە نەتەوەییەکان ساز بکا و ببێتە هۆی وەخۆکردن[1] کە بەپێچەوانەی سیاسەتی هەڵەی وەلانانە[2] هەروەها بەسەرنجدان بەو بابەتە کە ڕاستەقینە بەرهەمی ئیدیۆلۆژییە و شتێکی لەپێشدادیاریکراو

1 inclusion
2 exclusion

نییە بەڵکوو سازکراوە[1] چەمکی کەرتی سیاسی دەتوانێ لە دارشتنی ستراتیژیی ڕزگاریخوازدا یارمەتیدەر بێ.

[1] constructed

## سەرچاوەکان و پەراوێزەکان:

[1] Georges Gurvitch, *Études sur les classes sociales*, Paris: Gonthier, 1966.

[2] Erik Olin Wright, *Classes*, New York and London: Verso, 1997, p. 6.

[3] لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا دەیبەیتێکی گرینگ لە نێوان ئی. پی. تامپسن و رالف دارندۆرف هەبوو سەبارەت بە سروشتی چینی کۆمەڵایەتی. تامپسن بۆ پێناسەکردنی چەمکی چینی کۆمەڵایەتی لەسەر *پەیوەندی* پێداگری دەکرد لە کاتێکدا دارندۆرف لەسەر *رۆڵی کۆمەڵایەتی* سوور بوو. بۆ زانیاری پتر بڕوانە پێشەکیی کتێبەکەی تامپسن:

E. P. Thompson, *The Making of the English Working Class*, London: Victor Gollancz, 1963, pp. 8-13.

[4] Karl Marx, *The Eighteenth Brumaire of Louis Bonaparte*, edited by Mark Cowling and James Martin, London: Pluto Press, 2002, pp. 63, 100-101.

[5] Karl Marx & Friedrich Engels, *Manifesto of the Communist Party*, translated by William Reeves, Utrecht: Open Source Socialist Publishing, 2008, p. 9.

[6] Ralph Miliband, *The State in Capitalist Society*, New York: Basic Books, 1969.

[7] Nicos Poulantzas, *Political Power and Social Classes*, London: New Left Books, 1973.

[8] Detlef Muhlberger, "The Sociology of the NSDAP: The Question of Working-Class Membership," *Journal of Contemporary History,* Vol. 15, No. 3, July 1980, pp. 493-511.

[9] Daniel Oesch, "Explaining Workers' Support for Right-Wing Populist Parties in Western Europe: Evidence from Austria, Belgium, France, Norway, and Switzerland," *International Political Science Review / Revue internationale de science politique*, Vol. 29, No. 3 (Jun., 2008), pp. 349-373.

[10] Barrington Moore, *Social Origins of Dictatorship and Democracy: Lord and Peasant in the Making of the Modern World*, Boston: Beacon Press, 1993.

[11] Erich Fromm, *Escape from Freedom*, New York: Holt Paperbacks, 1994.

[12] Enán Arrieta Burgos, "The Law in the Philosophy of Jean-Paul Sartre", in A. Sánchez & J. Cervi., *Reflexões contemporâneas sobre direitos humanos*, Santo Ângelo: Furi, 2016, p. 103.

[13] Erik Olin Wright and Michael Burawoy, "Sociological Marxism," in *Handbook of Sociological Theory*, edited by: Jonathan H. Turner, London: Springer, 2006, p. 467.

[14] Gholam Reza Afkhami, *The Life and Times of the Shah*, Berkeley: University of California Press, 2009, pp. 227-229.

Humanities

[15] لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیش کۆلۆنیالیستەکان ریفۆرمی زەوییان کردووە بەڵام بە هەندێک هۆکاری ئەمنی و تێکنیکی بە نیوەچڵی جێبەجێ کراوە. بۆ نموونە، حکوومەتی ناوەندیی عێراق لە ساڵەکانی ١٩٥٨ و ١٩٧٠ ریفۆرمی زەوی ڕاگەیاند و لە ناوچە عەرەبییەکان جێبەجێی کرد بەڵام لە باشووری کوردستان بە نیوەچڵی جێبەجێ کرا و لە هەندێک شوێن هەر جێبەجێ نەکرا. لە دوای ١٩٩١ کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا، دوو حیزبی دەسەڵاتدار هەوڵیان دا پەیوەندییە فیوداڵییەکان بەرهەم بهێننەوە بۆ ئەوەی دەنگی سەرۆک هۆزەکان بە دەست بهێنن بەڵام ئێستا ئەوانەی کە وەک سەرۆک هۆز، بەگ یان ئاغا دەناسرێن، زۆرتر بوونەتە مووچەخۆری حکوومەت و هەڵسووڕێنەری دیوەخانەکان کە بە جۆرێک یارمەتیدەری حکوومەتن بۆ ڕاپەڕاندن و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان. واتە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی بە پاشماوەکانی چینی دەرەبەگ سپێردراوە کە زۆر جیاوازە لەو خاوەندارێتی و دەسەڵاتەی لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا هەیانبوو و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ چینی جووتیاری بێ-زەوی هەیانبوو. بە گشتی، ئێستا لە باشووریش پەیوەندییە فیوداڵییەکان زۆر لاواز بوونە و پەیوەندیی کاپیتالیستی لەسەر بنەمای پارە و بازرگانی و قازانج-تەوەری لە هەموو پارچەکانی کوردستان بە هەندێک جیاوازیی وردەوە زاڵ بووە. بۆ زانیاریی پتر سەبارەت بە ریفۆرمی زەوی لە باشووری کوردستان و عێراق بڕوانە:

M. Riad El-Ghonemy, *The Political Economy of Rural Poverty: The case for land reform*, London: Routledge, 2006, pp. 174-182.

[16] Herbert Marcuse, *One-Dimensional Man*, London: Routledge, 2006, pp. 260-261.

[17] ئەگەر بمانەوێ هاوتایەکی ئینگلیزی بۆ چەمکی "کەرتی سیاسی" دابنێین، دەتوانین بڵێین political slice.

Humanities